# ژیاننامەی

# الشيخ محمد بن عبدالوهاب

ڕاڤەکردنی
**مامۆستا کامەران کەریم**

نووسین و ئامادەکردنی
**شیخ موصعب**

# پێشەكی:.

الحمدلله والصلاة والسلام علي رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اهتدي بهداه ،دێنە سەر كيتابى (كشف شبهات) ريسالەی كشف شبهات إن شاءالله دانراوی شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب ی كوری سولێمانی تەميمی يە) رەحمەتی خوای لىٚ بێت ، هەروەكو واباشە هەركيتابێك كە ئەيخوێنيەوە ژيانى موئەليفەكەی بزانى و شارەزايبى ، ئەمرۆ كە دێنە سەر كيتابى كشف شبهات ژياننامەی شێخ(محمدی كورى عبدالوهاب) باس ئەكەين بە پشتيوانى خواى تعالى ، لەبەر ئەوەی ژياننامەكان خۆی لەخۆيدا بەراستى هيمەتێكى زۆر گەورە بۆ طاليبى عيلم دروست ئەكات يانى بەراستى لەخوێندنەوەی ژياننامەی صاليحاندا دەعوەتدا عولياندا مەشايخى ئەم دەعوەيەدا لەپێش هەموويانەوە پێغەمبەر(محمد)(صل الله عليه وسلم) پاشان ئەنبيا ورسول پاشان ئەوانەی شوێنيان كەوتوون هيمەت بۆ ئينسان دروست ئەكات ترس لەدڵى ئينسانى داعيدا ئەرەوێنێتەوە دووشت دروست ئەكا :

١:هيمەتت بۆ دروست ئەكا كە هەول بدەی.!

٢:وەترسيش ئەرەوێنێتەوە كە كەسانێك بوون و هاتن و رۆيشتن تێكۆشانى خۆيانيان كردوو و دەعوەی خۆيايانيان گەياند.

جا كەوتم لەسەرووی هەموويانەوەی پێغەمبەر(محمد)(صل الله عليە وسلم) ئەو ژيانى ئەو تيداتێپەرى كردبوو لە (مەككە و مەدينە)دا و نارەحەتيانەی كە ئەو تێدا تێپەرى كرد هيچ يەكێك لەئێمە پىٚ تێپەرمان نەكردوە لەسەر ئەم دەعوەيە هەروەها ئەنبيا و صالحين هەروەها ئەوانەی كەوا لەم ئومەتەی ئيسلامەدا هەستاون بەتايبەتی زيندووكردنەوەی ئيسلام بە(تجديد)كردنەوەی نوێی كردنەوەی ئيسلامەكە ،يانى كاتێك ئيسلامەكە لەناو خەلكيدا وای لىٚ دێت كە معاليمەكانى بشارێتەوە كەسانێك كە خوای گەورە ئەيان رەخسێنێت كە ئەو معاليمانە جارێكيكە نوێى بكەنەوە نوێكردنەوە بەومانايە نايى كە شتىٚ زياد بكەن وشتى نوێی بێنن هەرئيسلامەكە خۆی ئەهێنەوە ئەو ئيسلامەی لەبيرى خەلك براوەتەوە بەهۆی

(بيدعـە و شـيرك وضـلالەت)بـەهۆی تێكدانـەی دەسـتی كەسـانی ناپەسـەند بـەهۆی جـەهلی جـەهلی جاهيلينـەوە بـەهۆی موشـريكينەوە بـەهۆی نيفـاقی مونافيقينـەوە كەسانێك دێن لەبەر خاتری خوای تعالی ديسـان ئيسـلامەكە بەخـەڵكی ئەناسـێنەوە جا ئەو فەترەيـەی كـەوا شـێخ(محمدی كـوری عبـدالوهابی كـوری سـولێمانی كـوری تەميمی ) تێدا ژياوە (رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت)وە ژياننامەكـەی زۆر گرينگـە كـە بيخوێنيتەوە بزانیٚ كە ئەم عالمە پايە بەرزە دەعوەيەكی كـردوە بـەتاقی تـەنها كـە لەخۆيەوە دەست پیٚ دەكا لەچ واقيعێكـا بـووە زۆر كـەس ئاگـای لـەوە نيـە ئاگـای لەژيانەكەی نييە لەچ واقيعێكا ئەو دەعوەيەی كردوە ئەو واقيعەی ئەو سـەردەمە چ شيرك و ضلالەتێكی تێـدا بـوە . پاشـانيش بەدەبـەها ردوود لەسـەر ئـەو دەعوەيـە نوسراوە بەدەيەها شت لەسەر ئەم دەعوە پيرۆزە نوسـراوە كـە ناشـرينيان كـردوە لەبەر چاوی خەڵكی بۆنمونە بەخەڵكی ئەلێن كەوا (خواريجە) ئەو خـەلك كـافر ئـەكا ئەوە وايە هەتا گەيشتۆتە ئەو رادەيە كەوا بلێن ئەصلی يەهودييـە ! نـازانم ئەصـلی يەهودی چۆن داواكاری ئـەكا لەخـەلك كـەبێن بـۆ توحيـدی خـالق بەخالصـی بـۆلای خوای تعالی يەهود كەی توحيدی خالصی پێی خۆشبووە ! گەيشتۆتە ئـەو رادەيـە كە بلێن ئەصلەكەی يەهودە !.تەبعـەن ئەمـە هـيچ گومـانی تيـدا نيـە هەركەسـێكی داعی موخليص هەلسیٚ تۆ تەماشای پێغەمبـەران كـە(عليـە الصـلاة والسـلام)پێيـان وتراوە چی ؟ جادوو گەر پێيان وتراوە شـێت پێيـان وتـراوە سـاحير كـاهين ئـەنواع ئەشـكال كەواتـە دەعـوەی راسـتەقينە تـۆ ئـەبیٚ وريـايی بـی يـانی ئـەو ردوودانـەی كەنوسراوە هەروا بەئاسانی ئينسـان لەخشـتە نـەبات توشـی فيقـدانی نـەكا بـەوەی پشـت كاتـە ئـەو دەعـوە پـيرۆزە پاشـان ئـەم دەعـوەی شـێخ(محمدی كـوری عبدالوهاب)شتێكی نوێی نيە بلێن والله لەپێش ئەودا شتی وانـەبووە ئـەنبيا ورسـول هەمووی بۆ ئەوە نێردراوە دەعوەكەی شێخ بريتيە لەدرێژەپێدانی دەعـوەی ئـەنبيا رسول بەخۆشی وايە و لەواقيعێكدا ژياوە دەعوەی پێغەمبەران كەتوحيـد و يـەكخوا پەرسـتی بـووە لـەواقيعی ئـەوا تەماشـای كـردووە لەهـەموو جێگايـەكان كـە ئێسـتا تەماشای ئەكەين يـانی هـيچ گونـد و شـار و شارۆچـكەيەك دێهـات و ولاتێـك و هـەتا

حەرەمەین  یانی بەدەورو بەریەوە ئەوە یەمەن و ئەوە بەحرێن و ئەوە عێراق و ئەوە شام و هەرچی لەشوێنەکان هەیە پربوو لەشیرك و ضلالەت .شیرك و ضلالەت بەچ مانایەك بەومانایەی کەوا شەخص پەرستی کردووە دار پەرستی کردووە یانی گەراونەتەوانیٚ بۆ غەیری خوای تعالی تەبعەن تۆ بگەرێتەوە بۆ غەیری خوا ئیتر لەپێغەمبەر داوابکەی و والعیاذ باللە(صل اللە علیە وسلم) یان لەصەحابە داوابکەی یان لە صالحین داوابکەی هیچ فەرقی نییە لەوەی کەتۆچۆن موشریکینی پێش پێغەمبەر(صل اللە علیە وسلم) لەلات و منات وعوزایان داوا ئەکرد . بۆچی فەرقی نیە چونکە خوای گەورە لەقورئاندا بەیەك کەلیمە تێمان ئەگەیەنێت ئەفەرمووی (وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ)[1] (مِن دُونِ ٱللَّهِ)کیٚ ئەگرێتەوە هەتا خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی مەلائیکە ئەکا لەگەل ئەنبیائانە لەگەل پیاوچاکانەدا هەرکەسێك لەئێوە گەر بلێن من خوام لەوپەری عەزابی ئەیەم خوای گەورە بەپێغەمبەری خۆمان ئەلیٚ(صل اللە علیە وسلم)(لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ)[2] بەپێغەمبەرانی پێشوو ئەلیٚ (وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ)[3] یانی هەموو ئەسوتیٚ و ئەروا بەهۆیی شیرکەوە .

[1] :سورة الأحقاف اية :٥
[2] :سورة الزمر اية :٦٥
[3] :سورة الأنعام اية :٨٨

## ژیاننامەی شێخ: محمدی کوری عبدالوهاب (رحمه الله) :

ناوی :_محمدی کوری عبداوهاب ی کوری سولێمانی کوری علی کوری محمدی کوری أحمد هەتا نەسەبەکەی وەکو باس دەکەن هەتا دەگەڕێتەوە سەر إلیاسی کوری مضری کوری نزاری کوری عەدنان) ئەم مامۆستا بەڕێزە لەشاری (العیینە) لەدایك بووە عیونە لەنجدە تەبعەن نجد و حیاز مەشهوربوون لەجزیرەی عەرەبی پێویستە کەلیمەی نجد و حیجاز لەسەر قوتابیانی عیلم لەلایەنی جوگرافیایەوە شارەزابن کەوا لایەنی رۆژهەلاتی مەنتقەکە پێی دەوترێی نجد ەلایەنی رۆژئاواشی لەلای بەحری ئەحمرەوە پێی دەوترێی حیجاز و یەمەن ، لەحیجاز تەبعەن (مەککە و مەدینە) هەیە لە نجدیش شارەکانی (درعیە و العیینە) هەیە هەروەها ئەوانەی کەوا لەوشوێنە کەوا کۆبوونەتەوە تا ئەچێتە لای بەحری .

ئەم مامۆستا بەڕێزە لە (العیینە) لەدایك بووە لەساڵی (١١١٥ﻫ) بەڵام لەچ بنەمالیەك بووە علماء  هەمویان ئەلێن لە بنەمالەیەکی زانست و زانیاری بوون یانی بیتی مالەکەیان بەیتی زانست و علیم بووە باوکیان مامۆستایەکی گەورەبووە و قاضی بووە وە هەوەرها باپیری قاضی بووە تەنانەت باوکی چوارە ساڵ لە (العیینە) قاضی بووە بووە وە لە(حوریملا)ش هەر چواردە ساڵ قاضی بووە (٢٨) ساڵ قضاواتی کردوە باپیریشی هەروەها مامەکانی هەروەها یانی بنەمالەیەکی عالم بوون ، وە دەستێکی زۆر بالایان هەبووە لەعیلم و زانیاریەکانی شەرعدا ، لەنجدا لەو ولاتەی کە ئەوانەی تێدا ژیاون لە (العیینە) و ئەو مەنتیقانە وە لەهەموو عالەمی ئیسلامی بەشێوەیەکی عام ئیهتمام بەلایەنی عقیدە و بیروبڕوا و توحید وەك پێویست نەدراوە لایەنەکانی وەکو(فقە و علومی أعلی) خەلك تێدا سەرمەشق بوون بەلام لەڕووانگەی عقیدەوە هەر واقیعەکە خۆی ئەیسەلمێنیت کەوا واقیعێکی پر لەشیرك و ضلالەت بووە قوبی سەر قەبرەکان تەنانەت بگرە مەککە و مەدینە چواردەوری و حەرەمەین هەمووی خەلك گەراونەتەوانیٚ بۆ پەرستنی قەبر و دار و بەرد و ئەو بابەتانە  یانی ئەو (بەقیعە)ی کە تۆ ئێستا ئەیبینی کەساف هیچی لیٚ نییە نەبەرد نەقەبری هەلبەستراوی تیدا ئەوکاتە وانەبووە لەزەمەنی ئەوان .

لەلای باوکی عیلمی وەرگرتوە هەتاکو قورئانی لەبەر کردوە لەتەمەنی (١٠)سالیدا زانیارییەکی باشی وەرگرتووە پاشان زیرەکیەکی زۆر عجایبی هەبووە وە لەبەر کردنێکی عەجایبی هەبووە لەدوای ئەوەلە (١٢,١١)سالی لەباوکی داوا دەکا ت کەوا بڕوا بۆ حەجکردن و ئەروا بۆ حەج کردن ئەچیَ بۆ مەککە لەگەل علمای ئەوێیدا کۆ ئەبێتەوە پاشان ئەچێتە مەدینە و لەگەل علمای ئەوێشدا ئاشنا ئەبیَ بەعالمەکانی ئەوێش لەوانە شێخ (عبداللە کوری ئیبرهم ال سیف)شێخ(محمد حیاة السندي) وە زۆر زۆر موتەئەسیر ئەبیَ بەو شێخە کە شێخی حەدیسە بەراستی ئەو کاتێك ئەچێتە مەدینە تەماشا ئەکا خەلك لەناو مزگەوتی پێغەمبەردا(صل اللە علیە وسلم) هاوار ئەبەن بۆ قەبری پێغەمبەر(صل اللە علیە وسلم ) (یارسول اللە) إستغاثەی پیَ ئەکەن و داوای لیَ ئەکەن ئەم حالەتەی زۆر زۆر پێناخۆش ئەبیَ بەعالمەکان ئەلیَ لەوێی بەشێخ (حیاة)ئەلیَ تۆ ئەمەت بەلاوە چۆنە ؟ بیزاری خۆی دەر ئەبرێی ئەویش زۆرزۆر بێتاقەت ئەبیَ ئەویش لەو ئسلوبەی کە خەلك گرتووتیانە بەر لەداواکردنی لەغەیری خوای تبارك وتعالی هەتا پیَ ئەلیَ تۆ ناتوانی ئەمە بگۆریی ؟ ئەلیَ منیش و تۆش ناتوانین ئەمە بگۆرین .

یانی بزانە لەچ واقیعێکان کە نەتوانن بەخەلك بلێن هاوار مەکەنە غەیری خوا و مەلێن (یارسول اللە) واقیعەکە ئاوایە جەوێکی هەتا پر شیرکە یانی ئەگەر ئەو قسانە بکەی لەلای خەلك تۆ ئەبی بەکافر نەك ئەو کافرکەی ئەو تۆ کافر ئەکا .

لەوێی علمێکی زۆر وەرئەگرێت لەسەر دەستی ئەو علمایانە تەنانەت ئەلێن إجازەی (کتب ستة) وەر ئەگرێی دوای چەند ماوەیەك هەندێك لەئەهلی عیلم ئەلێن ئەروا بۆ (بەصرا) هەندێك ئەلێن ئەگەرێتەوە بۆ نحد ودوای چەند جاردێت و ئەروات و پاشان المهیم رحلەی عیلمی خۆی ئەکاتە کە ئەچێتە (بەصرا) لەوێی لەگەل عولمابتنب ئەوێی کۆئەبێتەوە کتێبەکانی شێخ الأسلام بەدەستی خۆی ئەنوسێتەوە هەرچیەکی دەست کەوێت لە کتێبەکانی شێخ الأسلام (إبن التیمیە وابن القیم) و ئەوانە بەدەستی خۆیی ئەگەوێتە نوسینەوەیان ئیستفادەیەکی باشیان لیَ ئەکات

وەدەکەوێتە دەعوە کردنشتەوە داوای ئەوەی کەوا علمێکی باش پەیا ئەکات بەلام بێگومان لەبەصراش یانی ئەوانەی کەوا دژی توحیدن ئەوانەی کەوا حەز لەشەخص پەرستی و هاوار بۆغەیری خوا ئەبەن پێیان خۆش نییە و دەری ئەکەن لەوێی زۆر بەنارەحەتی ئەچێتە مەنتیقەی (زوبێرو) لەوێش بەهەمان شێوەش پاشان ئەیەوێت بەرەو شام بڕوات هەندێك لەئەهلی عیلم ئەلێن لەبەر ئەوەی ناتوانی پارەی سەفەرو پێداویستسەکانی بەدەستەوە نیێ دەگەڕێتەوە بۆ بەصرا پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ ولاتی خۆی بۆ (العیینە) لەبەلام باوکی لەبەر ئەوەی نیزاعی هەیە ئەمیری (العیینە) نیزاعی دروست بوە لەگەل ئەمیری (العیینە)باوکیشی کە قاضی ئەوێی بووە ئەویان لە قضاوات خستوە ئەڕوات بۆ (حوریملا)لەوێ ئەبێ بە قاضی یانی باوکی شێخ(محمدی کوری عبدالوهاب)بۆیە ئەویش ئەچێتە حوریملاء زۆر لەوێی ئەبیت کە ئەچێتە ئەوێی لەداوی ئەوەی هەست ئەکا بەو هەموو بیدعە و ضلالەتەی ئیتر بۆی تەحەمول ناکرێت ئەکەوێتە دەهوە کردن ئەلێرەدا سەرنجتان ڕائەکێشین بۆ دوو خاڵ :

١: کەسانێك لەئەهلی بیدەع وضلالەت دەورێش و صۆفیەکان ئەوانەی کەوا حقدیان هەیە بەرامبەری دەعوەی توحیدی شێخ(محمدی کوری عبدالوهاب) چی دروست ئەکەن ؟ ئەم شوبهەیە دروست ئەکەن تەنانەت باوك و براکەشی رقیان لێ بووە ، کەبراکەی ناوی (سولێمان)بوە ، رقی لێبووە وەباوکیشی کەناوی (عبدالوهاب) بوە یانی وتویانە کەوا ئەو دەعوەیەی کەتۆ ئەیکەی هەلەبوە چونکە ئەبێ ئەوها بلێت بەوشێوەیە دەعوە بکەیت و باسی ئەوە بکەیت و کە داوا لەغەیری خوا بکەی و ئەوبابەتانە المهیم هەتا کیتێبێکیان داوتە پاڵ براکەی براکەی کتێبێکی داناوە[٤] تەبعەن ئەمە هیچی ڕاست نیە گەر بگەڕێتەوە سەر دەعوە هیچی وانین ئەمجۆرە حالەتە کتێبە و دانراوە دراوەتە پالّ براکەی بۆ ئەوەی کەوابلێن ئەوەتا براکەشی رەدی داوەتەوە .

[٤] ناوی کیتابەکە (السوع إلیه فی الرد غلی دەعوە الوهابیە)

راستە لەبیدایەتدا یانی تێگەیشتنی ئەو حەقە ئاسان نییە لە هەرشوێنی تۆ ئەو دەعوە بکەی لەبەر بوونی شوبهات لەبەر بوونی گومان لەسەر ئەو دەعوەیەدا رد فیعل هەیە بەلام الحمدلله علماء ئەلێن گەراوەتەوە (سولێمانی )برای قائیل بووە بەو دەعوەیە الحمدلله باوکیشی تەبعەن ئەوە مودەیەی کە لە (حوریمیلاء) بوو شێخ(محمدی کوری عبدالوهاب)ئەویش کەلەوێی لەگەلیدا ژیاوە کاتێك کە باوکی ئەمرێی تەبعەن ئیتر مەنتیقەکە بێتاقەت ئەبن لەو ئەو دەعوە توحیدە راستەقینەی کە شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەیکات یانی بۆیان قبول ناکرێت بۆیە ئەیانەوێت بیکوژن ئەویش ئەوێی بەجێدەهێلێت و ئەگەرێتەوە (العیینە).

کە ئەگەرێتەوە العیینە لەوێی ئەمیری العیینە لەگەل شێخ(محمدی کوری عبدالوهاب)دا دەعوە ئەبەن بەرێوە وە شێخ(محمدی کوری عبدالوهاب) تێ ئەگەیەنێت گەر تۆ بێت و ئەم دەعوەی (لا الە الا اللە) بگەیەنێت ئەوا چی ئەبێت ؟ خوای تعالی سەرت ئەخات و وەمولك و سەروەت و سامانیشت پێ دەبەخشێت هەروەکو چۆن غنیمەتی بەپێغەمبەر(صل اللە علیە وسلم ) لەدوای بلاو کردنەوەی دەعوە و ئەوبابەتانە لەگەلی خەریك ئەبێت الحمدلله دەعوەی تەوحید ئەکەن هەتا ناوی شێخ بلاو ئەبێتەوە بەتەواوی مەنتیقەکانی نجد و لای ئەمیرەکانی ئەوشوێنانەی کەوا لەنجدا .

یانی قوبی سەر قەبرەکان ئەروخێنن قەبرەکان تەخت ئەکەن تەبعەن تۆ گەر ئەمیرت لەگەلدا بێت ئەگەر سەرکردەیەکت لەگەلدا بێت خەلك ناتوانی هیچ بکا بۆیە شێخ الأسلام (إبن التیمیە) قسەیەکی زۆر جوان ئەکا ئەلێ پێویستە هەر موسلمانێك هەولبدا بۆئەوەی قورئان و حەدید بگەێنێت بەیەك . قورئان بەبێ حەدید ناروا حەدید بەبێ قورئان ئیستفادەی نییە واتا چەك بەبێ قورئان نابێ قورئانیش بەبێ چەك نابێ یانی ئەبێ هەردوو حالەتەکە بگەینێ بەیەك دی بۆ ئەوەی دینی ئیسلام بەرین بەرێوە شێخ الأسلام (ابن التیمیە)ئەفەرمووی( ئەگەر دین بەبێ هیز و توانا بڕوا وەکو چی لێدێت ؟! وەکو نەصرانیەکانی لێ دێت کە دوور لەدەولەت و دوور لەتحکیمی شەرعی خوا بە رەزیلی و بەزەلیلی خۆیان رازی ئەبن ئەگەر بیت و

سەروەت و سامان و چەكيشت هەبێ بەبێ دينی خوای تعالی بيبەيت بەرێوە وەكو يەهودت لێ دێت كە گوێيان نەداوتە دين و هەرخەريكی تەماح و خەريكی دنيابوون لەبەر ئەوە ڕێگەی يەهود ونصارايە )ئەگەربێت و بتەوێت دين بەبێ هێز بەريی بەرێوە هێز بەيی دين بەريی بەرێوە ئەوەيەكە كە لەقورئاندا خوای تعالی بەئێمە ئەلێ كە هەموو ڕۆژی لەنوێژەكانيدا چی بخوێنەوە سورەتی (الفاتحه) كەبلێن (صِرَاطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ )[5] خوايە ڕێگەی پێغەمبەر (محمد) مان پیێ نيشان بدە (صل الله عليه وسلم) كەدين و چەكی پێكەوە برد بەرێوە نەك دينی نەصرانی كەدينی بەبێ چەك برد بەرێوە و نەك دينی يەهود كەچەكی بەبێ دين بردوە بەرێوە .

كتێبێك هەيە ناوی (تذكرة أولي النهى والعرفان بأيام الله الواحد الديان)[6] باسی تاريخی ولاتی حيجاز ئەكا لەشێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) هەتا زەمانی خۆيی ، لەتەرجوومەی ژيانی شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) ئەلێ پێمان خۆشە كەوا باسی غەوربەتی ئيسلام بكەين لەو كاتەی كەوا ئەويی تێدا ژياوە يانی ئێستا باسی ئەو وايعە ئەكەين بزانين ئەو واقيعەی ئەو تێدا ژياوە چ واقيعێك بووە !

ئەلێ (قد أحببنا ذكر شيء من غربة الإسلام والدراسی بين الأمه لتعلم ما لهذا شيء الذی أقام الله به معالم مل بلكشف والبدع والضلالات) بابزانين ئەو واقيع و غوربەتەی ئومەتی ئيسلامی تێدا ژياوە و ئيسلامی ڕاستەقينەی لێ دووكەوتۆتەوە لەو زەمانەدا چۆن بووە ؟

ئێستا يەك يەك شوێنەكان باس ئەكا :

**نجد:**

ئەلێ (فأما أهل نجد فلاتسئل عن ماهم فيه) يەكەمجار باسی نجدمان بۆ ئەكات ئەلێ هەر مەپرسن چ ضلالەتێكيان تێدا بوە وقعی دياری خۆی شێخ (محمدی كوری

[5] :سورة الفاتحة اية :٧
[6] :كيتابی شێخ:إبراهيم كوری عوبێد ال عبدالمحسنه لەعولمايەكانی ئەهلی قسيمە تەقريبەن هەشت موجلەدە .

عبدالوهاب) لەواقیعی خۆیدا گەراوە و دەستی کرد بەدەعوە کردن ئەوە بوو لە العیینه دەستی پێکردوو لەبەرچی ئەو دەعوەیەی کرد بزانە چ واقیعێك هەبوە لەوێی ئەلێ (ذاك من الغباوت فقد کانوا في بدع المظلیمه وفتن مدالهیمه قد أحط المشكلة الأطباء إذاك كثير إن أهل نجد قد بالغ الشيطان فی كيدهم ، وجد وكان ينطابون قبر الزيد بن خطاب . وقباته وعلقين مالهم به يرون أنهم يقضي لهم الحواج ويزعمون أنهم أكبر المسائيل)ئەهلی نجد قەبرێکی شهور هەبووە لەلایان ناوی (زید کوری خطاب)بووە ، ئیتر چووینته لایان هەموو أعمال و هاوار و داوا کردن و هەموشتێکیان پێوە بەند کردوە یانی خوایان لەبیر چۆتەوە إلا ئەو قەبرە نەبێت ئەلێ قوبەیان بەسەرەوە دروست کردوە لەلایەن ئەو قوبەیە (کانت هذه القوبه من أعظم أصنام أهل نجد تراق حوله دماء ويساع عندها وتحفروا الجباه وتقبلوا بشفاء) یانی ئەو قوبەیە ئەو دارە و بەردە ئەو شوێنە بەهەموو شێوەیك خەلك وەکو بتەکانی قوریش ئەیان پەرستن حەیوانیان لەلایدا سەرئەبریی هاوار ئەکرا خۆیان لەخۆلا وەر ئەدا لەوشوێنەدا وە هەروەها روویان تێئەکرد ماچیان ئەکرد.

(وتخذع أكادير لديها وتنكسير رؤس وتعالي الله ملك قدس)یانی گەورە لەوێی خۆی بەهیچ نەئەزانی (ويتردون إلى قبر انهم يجعمون من القبر ضرار وأزوار) قەبرێکی تر ناوی(ضرارکوری أزور)بوە (كأنه كذب وبهوتان والمزور)موئەلیف ئەلێ گومانیشی تیدا نیە کە درۆ بوە قەبری ئەو نەبوو ئەبینی لەسەران سەری دونیادا لەهەندێك شوێن مەسەلەن هەندێ قەبر بەناوی هەندێ کەسەوە هەندێ صحابەوە ئەوەش نیە لەراستیدا ! شەیتان دروستی ئەکا بۆئەوەی خەلك لەلای خوای گەورە و وەلەعیبادەتی خوای گەورە دوربخاتەوە ! ئەلێ نەخلێکیان هەبوە کە ئەزانن نەخل نێر و مێ هەبوە ئەلێ (وكذالك اضم عندهم نخلم حال ين تابهم نيسائهم والرجال ويفعلون عندهم من أقبحل فعال)دار خورمایەك هەبوە دیارە دارخورمایەکی نێرە لەلایەوە ژن وپیاو ئەهاتن بۆی خراپترین ئیشیان ئەنجام ئەدا لەوێدا ! (وكانت المرأة إذا تأخرعن زواج والنتضرة به الزواج تذهب اله وتذن بها الرجاإنتهال) ئەگەر ئافرەتێك شوی نەکردبایە یان درەنگ شووی بکردبایە نەهاتبانایە داخوازی ئەچوو

بۆلای ئەو دار خورمایە باوەشی پێدا ئەکرد هاواری ئەکرد ئەیوت هاواری لێئەکرد کەوا (یافحل الفحول وريد زوج قبل حل)ئەی نێری نێران من ئەبێ پیاوێکم بدەیتی پێش ئەوەی سال تەواو بێ ،ئەوها بوو بەم شێوەیە ئەوە واقیعی (نجد)بوو .

دارێکیان هەبوو(وقد تشبث به شيطانه وعتلق يفعلون ذلك الأولاد يسلمون وعن الموت يجارون)ئەهاتن بۆلای ئەو دارە  پەرۆیان پێوەئەکرد بەرەکەتیان ئەدایێ دوای پاراستنی خۆیان ومال و منداليان لێ ئەکرد هەروەکو چۆن لەکوردەواری خۆشمان.

لە (درعيا) ئەلێ تەبعەن (درعيا)شوێنی (محمدی کوری سعود) پێش ئەوەی کەوا دەعوەی (محمدی کوری عبدالوهاب)ی بۆ بچێی لەوێی ئەیوت غارێکی گەورە هەبوو (ئەشکەوت)(يزعمون أن الله فلق إمرة يسماء إبنت الامير)ئەو ئەشکەوتە خوای گەورە ئەوهها شەقی کردوە لەو چیایەدا بۆچی وای لێکردوە بۆکچی ئەمیرێکی کردوە(أراد بعض فسق ان يضلمها أو يضير فساعت داعتا الله فنفلخها بإذن وليه الكبير)لەوێی هەندێك کەس ویستویانە پەلاماری بدەن هاواری کردوە خوای گەورە ئەو ئەشکەوتەی بۆ دروست کردوە چۆتە ناویەوە(وكان الله من ذلك سوء مجير)خوای گەورەش پاراستویەتی لەو خراپەکارانە ئینجا چی ئەکەن ئەمە عقیدەیان لەو ئەشکەوتەدا چیە !(فكانوا يسلون إلي ذلك الغار الحلمة والخبزة ويدر)نان و گۆشتیان بۆ ئەنارد بۆ ئەو ئەشکەوتە وەشتیان بۆ هەدییە ئەکرد بۆیان ئەنارد(ويبحثن إله ويقربون )شتیان بۆ ئەنارد بۆخۆیان لێ نزيك ئەکردەوە (فالعياذ بالله مالا يعملون) هەروەها ئەلێ لەدرعیا دێیەك هەبوە(يزعمون أن فيها بعض صحاب مقبور فهذا أصبح حضم من عيبادته المنفور).

ئەلێن لەدرعیەش دێیەك هەبوە وتیانە هەندێك صحابە لەوێش نێژراون ئەچوون بۆ ئەوێی و سەردانی قەبر وقبوریان ئەکرد جا بۆ ئەوەی بزانی دەعوەی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)لەچ واقعێکدا بوە لەچ غوربەتێکی ئیسلامدا بوە هەستی بەوشتانە

هەموو کردوە کەهەستاوە دەعوەی تەوحید و (لا اله الا الله)ی بەرز کردۆتەوە ئیشەکەی زۆر زۆر قورس بووە کاتێك کە تەنها دەستی پێکردووە لەجێیەکی ئەوهاش کە مەککە و مەدینە بێ کە حیجاز ونجد بێ ،

ئەلێ (عجائب المضحك أن بعض هذه الالية بالغالب بلا يحرض لها أصل)ئەلی ئەوەی کە ئینسان پێ کەنینە زۆر بەی ئەوشتانەی هەر ئەصلی نەبوو دروستکراون(ولافضل بل زين لهم شيطان عيبادت اتان ومتحان) شەیتان ئەوشتانەی هەموو رازاندۆتەوە ! پاشان ئەلێ(وقد فشت هذه الإعتقادات الباطل والمذاهيب ضال والعوادر جاهر والطرائيق الخاسيرة وعمت وطمت حتي بلاد الحرمين شريفين )

## مەککە و مەدینە :

هەتا (مەککە ومەدینە)شی گرتبوویەوە جا ئێستا باسی ئەوەمان بۆ ئەکات ئێوە پێتان سەیر نەبێ لەکاتێکدا لەو کاتەدا ئێستاش هەر هەیە تەبعەن لەلای شیعەکان یان رافضە کان (قبحهم الله) کە (ئەبو تالیب ) زۆر بەرێزە کە (ئەبو تالیب) یەکێك بوو کە بەموشریکی مردووە خۆتان ئەزانن ! کە خوا رێگەی نەدا پێغەمبەر(صل الله عليه وسلم) دوعای بۆ بکات ! کەچی لەوێی قوبەیەك هەیە بەناوی قوبەی محجونە لەگەل قەبری (ئەبوتالیب) علی ئە ساس کەمامی پێغەمبەرە(صل الله عليه وسلم)(فيأتون للإستغاثة عند نزول المصائب وحول أزمات وانواكيب بسماعات وعلامات للمطالب وكانوا يعضمون غاية تعظيم)هەرزۆر بەرێزەوە سەیریان ئەکرد هاواریان بۆ ئەکرد داوای حاجیاتی خۆیانیان لێ ئەکرد(فلو أتا ساريقون وغاسيب أوضالم أتا إلي قبر أحدهما لم يتحرض له احد )هەرکەسێك بهاتایە بۆلای قەبر و قبویەی ئەودوانە ئیتر زالم بوایە بکوژبوایە خراپکار بوایە دزبوایە کەس نەیدەوێرا دەستی لێبدا لەبەر حورمەتی ئەو دوو شوێنە ! قەبری ئەو محجونە لەگەل قەبری

(ئەبو تالیب)ئەلێ(لما يرون لم من جوب الإحترام والمكاريم )واجبە ئیحترامی بگریت و ڕێزی لێ بنێت !

پاشان (ويفعلوا عند قبر مويمون أم المؤمنون عند قبر خديجة زوج خاتمة النبي صل الله عليه وسلم تشمئزو قلوب المؤمنين )قەبری دایکی موسلمانان (مەیمونە )لەگەل قەبری (خدیجە)لە (مەککە)چی ئەکرا لەوێدا ! ئەلێ شتی وا ئەکرا ئینسان قێزی دێتەوە ! لەچی ؟ (من إختلاط النساء هوناك برجال وفعلل فواحيش والمنكراة )لەلای ئەوقەبرانە ئەنواع و ئەشکال فەواعیش و منکرات ئەکرا (وسيل أفعال ويشقون الجيوب ويرفعون الأصوات وفعلون من شرك وضلال أعظم المنكراة وهاكذا كان سائر القبور فى مككة والمدينة وقد نسيبة علي القيباب تمرغ المشركون فى تلكل رحه)یانی خەلك قیباب و قوبە وقەبر بینا ئەوشتانەیان لەسەر دروست کردبوو ئیتر ئەمە واقیعەکەی ناو (نجد وحيجازە ).

## طائیف :

لە (طائیف ):قەبری (إبن عباس)ی لێ یە (إبن عباس)کەلە(طائیف) بوو خەلك لەفقرا ئەچوون بۆلای (فكان ينتابوا الفقراء وذوالإفلاس من أهل الكفر ونيفاق والإبلاس ويستميدون منهم رزق وغوثة وكشف ضر والبأس ويقف سائل عند القبر تضرع مستكينن ويبدل فاقة أله مستعينا )ئەوەی فەقیر حال بوایە ونەبووبایە نەدار بوایە ئەچوو بۆئەوێی !ئەیان وت (إبن عباس)خەلك دەولەمەندئەکات ! خۆیان بەوپەری زەلیلی و بەوپەری فەقیری دائەخست وداوای مال و حالیان لێ ئەکرد ! (فيفعل عنده من الأمور شركة مالا تبلغوا والعبارة ولا تأسوه الإشارة وقد ذكرة محمد بن حسين عيمي زبيدي (رحمه الله) ان الرجل راء ما يفعلوا فيه أطائف من شرك)ئەلێ ئەم پیاوە (محمدی کوری حوسێنی عیمیی زبیدی ) ڕەحمەتی خوای لێ بێ بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەلێ پیاوێك پیاوێکی بینی باسی پیاوێکی کرد کەوا (راء ما يفعلوا فيه أطائف من شرك )چ شیرکێك لەوی ئەکرا لەلای قەبری (إبن عباس) لە (طائیف)(فقال إن أهل طائف لايعرفون الله )وتی ئەهلی (طائیف)خۆ نازانن خوا کێ یە ! هەر (إبن عباس)ئەناسن ! هیچیان بۆ خوا نەهێشتۆتەوە( إنما يعرفون إبن

عباس فقال لعم بعض من يترشح بعلم معرفتهم لابن عباس لابن عباس كافيةُ لانه يعرفوا الله )(سبحان الله) وتويەتی کاکە معریفەتی ئەو خەلکە بۆ (إبن عباس) کافیە ! ئەگەر ئەوان (إبن عباس)بناسن بەسە بۆ ئەوان چونکە (إبن عباس) خوا ئەناسێت ! ئەوان خواش نەناسن قەينا کە (إبن عباس) مادەم خوا ئەناسێت ئەمان برۆن داوا لە(إبن عباس)بکەن کافیە !(فقال لە بعض من يترشح بعلم معرفتهم لابن عباس كافيةُ لانه يعرفوا الله )ئەوەيە إعتقادی خەلکەکە !

یانی شوبهەی چیان هەیە ؟ مادەم ئێمە داوا لە(إبن عباس) بکەین ئەویش داوامان لەخوا بۆ ئەکات تەواو ! ئەمەیەکێکە لەو شبوهاتانەی کە شێخ لە کەشفی شوبهاتدا باسی ئەکات ئەڵێ(فضر اخرهذا شرك الوخيم وغلول قبح ضميم من المجانب الصراط المستقيم كيف ان شيطان إذ ستعولة على قلب العبد فإنه يردالمهالك )ئینجا بزانە ئەو شیرکە گەورەیە پەنا ئەگرین بەخوای تعالی ئەو غلوە ئینجا لەصالحین دا ئینجا سەیری ئەم ئایەتە (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ )[٧] خوای گەورە بۆ خۆی ئەڵێ ئەگەر عەبدەکان داوایان کرد لەمن پرسیاریان کرد لەمن کرد من نزیکم جوابیان ئەدەمەوە بەشەرتێك داوا لەمن بکەن ! یان ئەفەرمووێ(وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا )[٨] ئەمە ئایەتی قورئانە ئەم ئایەتانە هەمووی پشت گوێخراوە ! شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)لەم واقیعەدایە ! پێغەمبەری خوا (صل الله علیه وسلم )نەعەلەت ئەکا لە یەهود و نصارا بەچی نەعەلەتیان لێ ئەکا !(إتخذوا أنبيائهم مساجد)[٩]وانیە ! لەکاتێکا ئەوان عیبادەتی خوایان کردوە لەوێدا لە مزگەوتەکاندا بەس قەبری پێغەمبەرەکانیان کردوە بە مزگەوت ! لەکاتێکا ئەوها بوون ئەی ئەگەر قەبرەکان بپەرستێ ئەبێ چیان لێ بەسەربێت ! یان ئەمێنێتەوە تەماشاکە هەر لەوێی وەرە بۆ (مەدینە)وەرە بۆ (بەقیع)وەرە بۆ(شهدا أحود)بزانە (حمزە)چۆن ئەپەرسترا لەوکاتەدا !

[٧] :سورة البقرة اية :١٨٦
[٨] :سورة الجن اية :١٨
[٩] : اخرج البخاری (رقم ٤٣٥)

قەبری (حەمزە) وەلە((بەقیعا) ئەو صەحابانە چۆن ئەپەرستران داوایان لێ ئەکرا (وکذلك مايعفعلون عند قبر حمزة عن بقيع وفعل ذريم وأمر شنِع ويكل عن السان ولايبلغوا البيان)یانی زمان شل ئەبێت لەباس کردنی ! ئەوەندە شیرك وضلالەتی لێبوو ! ئەلێ (لقلت لم يبقاْء شيء لمالك يوم الدين وبدبرالخلايق الأجمعين فجز الله من هدمها وأزالها وسماء )ئەگەر ئەوانەت ئەبینی ئەت وت وەلا کاکە هیچ نەماوەتەوە بۆ خوای تعالی ! چونکە ئەوانە هەمووشتێکیان لێ داوا ئەکرێی ! طه لبی هیدایەیان داوا لێ ئەکرێی طه لبی منداليان لێ ئەکری طه لبی پاراستنیان لێ ئەکرێی هەمووشتێکیان لێ ئەکرێت بەلکو هیچ نەماوە بۆ خوا جا لەدەستی ئەوکەسە خۆشبێ کە ئەو قوبە و ئەو بینای قەبرە و ئەوشتانەی هەموو روخاند و لەناوی برد کە داوای دەعوەکەی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)رەحمەتی خوای لێ بێت لەکاتێکا کە هێز و دەعوە بووبەیەك باسی .

## جدده:

(جدده) ئەکا ئەوکاتە لە(جدده)ئەوە هیشتا موئەلیفی کیتابەکە هیشتان نەچۆتەدەرەوە بۆ یەمەن وشوێنانی تر ئیستا شوێنی تریش باس ئەکا ! ئەلێ لەبەندەری (جدده)(ماقد بلغ من ضلال حدة وعندهم قبر طول ستون ضراعاً )قەبرێك (٦٠)ضراع درێژبوو واتا (٣٠)مەتر وتیانە کێ بووە ؟(يزعمون أنهم قبر الحواء )ئەوە قەبری (حوا )یە ئینجا چونەتە سەریی وداوایان لێ کردوە(وقد بلغ عند الضلال غاية القصواة فمن لم يبدللحطام لسندة قبره أمه من الأنامى فإنه يعد من للأم ولا يخدل عليها للسلام)ئەوەکەسەشی شتی نەبردایە پارە و مال و ئەوشتانە نەبردایە یانی سەروەت و سامانی نەبردایە نەیان دەهێشت بچێتە ژوورەوە سەردانی بکات و سەلامی لێ بکات ! ئینجا بزانە چەند مالێ کۆکراوەتەوە ! لەوێی بەناوی چییەوە ؟ بەناوی ئەو قەبرەوە ! (فتجدهم يجبون من الاموالى مالا يخطر بالبالى أو يدور في الخيال وهذا القبر قد وضوع بعض الشياطين فأكثر في شأنه من إثم وباله من كذب)شەیتان بۆی رازاندووەتەوە بەوشێوە قەبر پەرستیان ئەکرد ! ئەمە بیلادی (حجاز)بیلادی (نجد) .

## میصر:.

میصر ئینجا لەمیصر لەو زەمانەدالەمیصر چی بوە ! ئەڵێ (ما بلاد المصر وسعيدوها واعمالها قد جمع من الاموري شركية والعيبادات و ثنية والدعو الفرعونية ما لا يتسع له الكتاب)ئەگەر باسی میصر بکەین بەکیتاب تەواو نابێ ئەوەندە پری بوە لەشیرك و ضلالەت لەوێی چی لێبوە ؟ (عنده مشهد البدوي الذي لايعرف له اصل ولا فضل ولا عيبادة)قەبری (بدوی )لێ یە کە هەر نازانرێی ئەصل و فەصلی کێ یە ! عیبادەی چیە ئەمە ! (بل قد افتتن به وصرف له الاله من دون الله)هەتا گەیاندویانەتە مستەوای خوای تعالی نەك ئەوە بەلکو ئەویان بەخوا زانیوە داوایان لەخوا نەکردوە (وقد جاوزوا به الامثاله عنده من المعبودين ما ادعتهم من الجاهلية إلاله تهم)ئەوەی ئەوان کردوویانە جاهیلیەت چۆن بۆ ئالیهەتەکانی خۆیان ئەیان کرد ئەمانیش ئەیان کرد (وجمهورهم يرى له من تدبير الربوبية وتصرف الكون بل مشيئة وقدرة اعمى مالم يقل مثله عن احد بعد الفراعية النماريدة و بعظهم يقول القطب احمد يرجعون اليه)ئەوەی کە بۆ ئەویان کردوە بۆ فیرعەونیش نەکراوە ! پێیان ئەوت (قطب أحمد)لەهەمووشتێکدا ئەگەڕانەوە بۆلای هەتا ئەڵێ هەندێك لەئەهلی میصر(يعتقدون ان احمد البدوي تصرف فى الكون) لەکەونا تەصروف هەبوە ! (و بعظهم يقول إن الذين يتصرفون فى الكون سبعة)ئەلێن حەوت کەس تەصروف لەکەونا ئەکا ! (و بعظهم يقول اربعة)هەندێکیان ئەلێن چوار ! (وكانوا بزعمه البدوي و الرفاعى و دسوقى و ابو علا وهاهولاء في المصر)ئەمانە تەصروف لەکەون ئەکەن ئەمانە لەمیصر بوون .

(وقد ذكر عبدالرحمن بن حسن ال شيخ رحمة الله عليه أنه في حالة في مصر وجد فيها عاليما متفننية أخذ يعبروا في مسائل الاصولى والفرعى فكأنه البحر الذي لاساحيل له فعجب به عنده الشيخ عبدالرحمن)ئەڵێ ئەمانە حالەتێکیان بەسەر هاتبوو شێخ (عبدالرحمان کوری حەسەنی ال شێخ ) لەژیانی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)

ئەگێڕێتەوە ئەلێ ئەو كاتەی كە لەميصر بوە عالمێكی زۆر زۆر بەتوانای بينی ئەلێ (أخذ يعبروا في مسائل الاصولى والفرعى فكأنه البحر الذي لاساحيل له)يانی كابرا بەحر بوو لەعيلمدا زۆر پێی موعجەب بوو شێخ (عبدالرحمان) (وأبدء من إجابه بذلك العالم برجل من اهل دين يثق به هناك فأجابه الرجل بقوله لا ترتبي بكلامه ) بەكابرايەكی وت شێخ (عبدالرحمان )لەئەهلی دين بوە ئەوكابرايە وتی ماشاء الله ئەو كابرايە چەند علمی زۆرە ! ئەوەندەی كە گوێی لەدەرسەكەی گرتبوو ! كەچی ئەويش پێی وت وەلای مەخەلەتێ بەعلمەكەی! (فإنه الممشرك) وتی وەلا كاكە ئەوە موشريكە ! وتيشی (سأطلعك على شركه الشيخ)ئەگەريش ئەتەوێی بەخوا شيركەكەشی بۆ دەرئەخەم ! هەر بەزمانی خۆی پێت بلێ (فجمع بينه وبمصر سأله بمسطصرا يا أستاذ كم الذين يتصرفون في الكون ؟)ئەم كابرايە لەعلومی كەباسی كرد بەحر بوو كۆی كردەوە لەگەل شێخ (عبدالرحمان)وتی بزانم چەند كەس لەكەوندا تەصرف ئەكەن !؟( فتكلم عالم شايخ بتعظيم قال يا بنية سبعة)كورم حەوت كەس لەعالمی كەونا تەصروف ئەكا ! (هم الله والبدوى والرفاعى ودسوقى وأبو العلا وعبدالقادرى جيلانى و سابع أسماء لهم )وتی ئەمانە هەموويان تەصروف لەكەونا ئەكەن ! يانی بەوهەموو عيلمەوە ئەبێ چی بكا عقيدەی وابێ كە لەغەيری خوا لەكەونا تەصروف ئەكەن ! وتی (فأما أحمد البدوى)بەلام (بدوى )ئەگەر تۆ وەسفی بكەی (فلا يدخلو نصرا ضرة ولا يخرجوا منه ضر إلا بإذنه)يەك زەرە يەكی بچوك چيە ميرولەيەك ! يان ئەو زەرەی كەتۆ لەئاسماندا ئەيبينی ئەو بچوكە ئەگەر بێتو بروا بۆ ميصر و دەرچێ بەبێ ئيزنی (بدوی)ناتوانی دەرچێتە دەرەوە ناشتوانێ بێتە ژوورەوە ! عقيدەی ئەوها بوە ! .

(فلتفت صاحب الشيخ عبدالرحمن إليه قائلا له إحمد الله يا أهل النجد على مامن النبية عليكم التوحيد )ئەلێ ئاوريی دايەوە وتی ئەی ئەهلی(نجد)وتی سوپاسی خوا بكەن كە ئێوە دەعوەيەكی موبارك هەبوە كەشێخ (محمدی كوری عبدالوهاب)ئەو

توحیدەی هێنایەوە جارێکیتر ئێوە لەوپەری نیعمەتی خودا ئەژین ئەوە واقیعی ئێمەیە !.

لەوە سەیرتریش شێخ (إسحاقی کوری عبدالرحمان ال شێخ ) ئەویش ئەلێ (أنه رأى في أيام رحلته إلي المصر الطلب العلم مجتمعا هائلا أعظم من إجتماع المسلمين عشية عرف عند الجبل رحمة ، فسأل عنه فقيل هذا مولد البدوي )کۆمەلێکی زۆر زۆر خەلك بینی ئەوەندە زۆر بوو خەلك لەعەرەفە چەند زۆرە ! دوو و سێ ملیۆن خەلك لە عەرەفەدا هەیە ئەوها خەلکێکی زۆری بینی وتی ئەمە چیە وتیان ئەمە مولودی (بەدویە)خەلك کۆبۆتەوە بۆ مولودی (بەدوی)ی ئەوە رۆژ وئیحتفالی (بدوی)یە ! (ورأى سوقا طويلا للبغاية لائقد أوقفا فروجهن ف ذلك اليوم لسيد البدوي)بازارێکی زۆر گەورەشی لەزیناکاران بینی بووکافرەکان ئەو ئافرەتانە وتیان ئێمە فەرەجی خۆمان وەقف کردوە بۆ هەرکەسێك لەبەر مولودی (بەدوی)بێ تام و لەزەتی خۆیی بکا ! سەدەقە بێ بۆ (بەدوی )(وينتی الفساق فيقعون عليهن متصدقات له فی ذلك المجتمع)ئینسانی فاسق دێت خەریکی ئەو ئیشە ئەبێت ئەلێ ئەم خێرە ئەکەم بۆ (بەدوی)ی بۆ مەولودی بەدوی.

(وكان يصل فی المصر من الكفر بالله وأشراك به مالم يصل به أبو جهل وأشياعيه )ئەوکوفرەی لەوێی ئەکرا (ئەبو جهل )لەزەمانی ئەودا نەدەکرا! جا وەکو وتمان ئەوە واقیعێکا لەزەمانی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)ئەوە بیلادی حەرەمینمان باس کرد ئەوە میصرمان باس کرد.

## يەمەن.

ئێسا دێتە سەر باسی يەمەن

(وكان ڤ شرقى صنعا قبرا يسمون هادي )لەرۆژهەلاتی شاری (صنعا)لەيەمەن قەبرێك هەبوە پێی وتراوە (هادی)ئەمە خەلك تەبعەن چونەتە لايی وداويان لیّ كردوە (وكذلك مايجل في بلدي برع من عيبادات عيبادتهم القبر التي يأتا إليهم مسيرت الأيام والليالي الطلب غوث وشكايت الحال )هەر لەيەمەن قەبرێك هەبوە چەندەها شەو و رۆژيان خستۆتە سەری تا هاتونەتە لای ئەو قەبرە يانی هاتون بۆلايب .

هەورەها ئەهاتن بۆ قەبری (بن علوان)ناويان ئەنا (منج الغارقين)يانی ئينسانی جاهيل (يسمين غواق منه منج الغارقين)بەو قەبرەيان ئەوت رزگار كەری غارقينە !

(حضر الموت شحر يافق عدن)هەر لەيەمەن لەلای ئەوان حەديروس .

هەبوو لەئەهلی موخا قەبری (علی كوری عومەری شازلی) هەبوو لەحودەيدا قەبری (صديق) هەبوو هەريەكێك لەم شوێنانە كەباسی ئەكا موئەليف ئەلیّ لەزەمەنی ئەوا بزانە عالمی ئيسلامی لەچ حالەتێكا ژياوە !..

ئەرزی نجران ئەلیّ (يجری عندهم تلاعب الشيطان وخلي ربقت الإمان لايخفى لي أهل العلم بهذا شأن من ذلك رأس يسما بسيد عبدوا بأنواع عبدوية وشرف راسما بالالوهية وأتم بطاعة وتصديق وتقديمي )ئەوەش لەوی لە نجران بەناوی سەيدەوە پەرستنيان بۆ ئەو ئەكرد.

## شام:.

دێتە سەر شام حەلەب و ديمەشق (وسائر البلاد شام فيها من تلك مشايد ونصب والاعلام مالايوافق أهل الآمان ولا تنائم الاديان ).

ئينجا باسی ولاتی ئێمەش ئەكا بەو عيبارەتە (وكذلك الموصل والبلاد الأكراد ظهر منها من أنواع الشرك والفجر والفساد فوق مايذكر يراد) ئەو هەموو شيرك وبتپەرستی هەبووە لە قەبری صالحين و ئەوبابەتانە.

## عێراق:.

ئینجا باسی عێراق ئەکا :ئەلیٚ مەشهدی حوسێنی هەبوە ! خۆتان ئەزانن مشهدی حوسێنی ئەلیٚ(قد اتخذت الرافضة وثن بل ربا مدبرا وخالقا يسرا وأعداو به المجوسية وأحيا به معابدتي لات والعوزا وكان علي أهل الجاهلية وكان يأتون مشهد العباس وشمهد على فيركب به ركعتهم ويسجود يدعوا بخالص الدعا من دون الله ومنهم يزعم أن زيارتهم أفضل من سبعين حجة)چۆن ئەچونە سەر ئەمە قەبری حوسێنە و ئەمە هی فلانە ئەوە هی فلانە ! ئەمی هی (عباس)ە وئەمە هی (علی )یە و وەهەتا ئەيانوت ئەگەر تۆ بچی زیارەتی ئەوانە بکەی لەحەفتا حەج باشترە ! لایەزالیش هەروایە ! .

تەبعەن ئەمە لەو زەمانەدا باسی ئەو زەمانە ئەکەین دەعوەی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) لەناو ئەو هەموو شیرکاتەدا دەرچوە بەتاقی تەنها وەکو وتم ئەبیٚ دوو نوقتە تەماشابکەین هیمەتت بۆ دروست بیٚ لەم زەمانەدا پاشان ترست لیٚ برەوێتەوە شەخصێکی ئاوەها لەناو ئەو هەمو شیرك وضلالەتەدا بەتايبەتی کە دەولەیەکی گەورە خیلافەتێکی گەورە حیمایەی ئەو شتانە ئەکا کەبریتیە لەدەولەتی تورکی ئەوزەمانە (عوسمانی) لەئاخیریدا ئا بەم شیرك وضلالەتە رازی بوون و بیٚ دەنگ بوون لەهەموو ئەوشوێنانەی کەباسمان کرد ئەو هەمووشیرك و ضلالەتە هەبووە.

ئەلیٚ (ويدعوه بخالص الدعا من دون الله ومنهم يزعم أن زيارتهم أفضل من سبعين حجة ، ولقد غلو من تلك مشايدي من شرك قبح أعظم مما يفعل نصارا من مسيح ، وكذلك ما يشهدون من مشهد كاظم وغيره وإذا كان يوم عاشورا فإن رافضة قد جعل مأتمن وهذا يسرخ وهذا يعث توراب علي رأسي يدعوا بلويل وثبوري وهذا يضرب صدرة والحديد والحشبى حتى يكون كأن ماصب الهب وكان من رافضة من يصلي من تلك مشايد ويركع ويسجود وقد صرف من الأموال والنوذري ،،،)لەوێش بۆ کاظم و سوجدە بردن عیبادەت کردن و پارە سەرف کردن و ئەم هەموو شتە ئەکەن کە ئەوەندە پارە و ئەوندە خێرو خێرات بەناوی ئەوانەوە ئەکەن وبۆئەوانی صەرف

ئەکەن کەبەچەندێکی بۆخۆیان ئەکرێی ! یەك لەسەر دەی بۆ خوای گەورەی ناکەن ! کەبلێ ئەوە لەپێناوی خوادا بکە نایکا بەس لەپێناوی کاظم ئەیکا لەپێناوی حوسێندا فلان و فلان ! ئەو هەموو مال و سەروەت وسامانە صەرف ئەکەن.

ئەلێ وەرە بۆ لای قەبری (ئەبو حەنیفە) لەو زەمانەدا قەبری(معروف كرخي)بزانە چ دوعایەك و داواکردنێکیان لێ داوا کردوە ئەو خەلکە ! چۆن فریمێسك ئەبارێنن لەلای ئەوخەلکە کابرا لەنوێژەکەیدا نیو فرمێسك نابارێنی کەچی ئەچێتە لای ئەو قەبرەیە شەیتان بۆی دروست ئەکا و فرمێسك ئەبارێنی مالی خۆی کاول ئەکا ! خشوع و خضوعی بۆ قەبرێك بۆ مقبورێك زۆر زۆرترێکە لەوەی لەبەردەمی خوای گەورەدا راوەستاوە !

ئەی (عبدالقادری گەیلانی )بۆ باس ناکەی ! (فقد فتنه به بالعراق فیأتون ضرحه بالبغداد ویسجدون لحضرته ویرون أنه لیداع یسمع من مودة بیعدا)هەرکەسێك لەشوێنکی زۆر زۆردووریش هاواری کا گوێی لێ یە ! (عبدالقادری گەیلانی)خەلکی عێراق بوە نەك هەر خەلکی عێراق خەلکی دونیا گەر تۆ تەماشابکەی ! بەتایبەتی لەعێراق ئەلێ دێن بۆ سەر قبرەکەی وە سوجدەی بۆ ئەبن وە إعتقادیان وایە کە ئەمە لەدووریشەوە بێ گوێی لەتۆ یە (ویجمع أنه یسمع شکایات ویغث الافات وزین المهم الشیطان عبداتهم یعتقده یتفأو العریق)ئاگریش ئەکوژێنێتەوە (وینج الغریق) کەسێك لەئاودا غەرق بێ بەس بانگی بکا رزگاری ئەکا (وصرف عیبادة من دون الله وبالجمل وهم شر أهل تلك أمصار وأضم من فناي الحق والإستکبار).

ئینجا وەرە بۆ بەصرا (وما توصت فیها من مثل قبر الحسن بصري والزبیر ) ئینجا بزانە چ لەو دوو قەبرە کراوە (فقد أکثر هناك الدعا والاستغاث وأقبل علي تلك المشاید وترجب إلیها عند شداید ولیس هناك منکرون لها ولا زاج ولاراد)کەس نیە بلێ وامەکە قەبرەکان ئەپەرستڕێی هاواریان بۆ ئەکرێی.

وەرە بۆ (شط)وەرە بۆ (مجراء ) بزانە لەغایەتی جهال وەرە بۆ (قتیف و بحرین)بزانە رافضە لەوێدا چەند زۆرە شیرك چەند زۆرە احەداسی مەجووسی (والمقامات الوثنیة مایضاد الملل محمدیة صلی الله علیه وسلم ویصادم الطریقة

الحنفية فلما أفاقة مهاذ الخطف وتلات مهاج البحر الشرك والكفر)ئائەم هەمووە ئەم هەموو لافاوی مەوجی لافاوی شیرك وضلالەتە عالەمی گرتۆتەوە ئینجا چی لێهاتوە ! دینی توحید لەناو خەلك لەبیر چۆتەوە ئاسەواری نەماوە بیدع و ضلالەت زۆربوە (تجرد هذا الشيخ رحمة الله على ودعوة الي )ئەم شێخە هەستا لەسەرەتای گەنجێتیەوە دەستی کرد بەدەعوە کردن ئیشەکەی قورسە یاخود قورس نیە یانی هەتا ئەمە باس نەکەین نازانی ئیشەکە چەند قورسە ! هەرکەسێك بلیٚ ئەوە وایە ئەوە هەلەیە پارچەپارچەی ئەکەن ! بەتاقی تەنها هەلدەستێی تەبعەن وەکو وتمان جا کە گەرایەوە بۆ(العينه)ئەمیری (العينه)یارمەتی دا تاماوەیەك بەلام ئەمیری (العينه)لەبەر ئەوەی کە تهدید کرا لەلایەن ئەمیر(أحساء )ەوە ئەمیر(أحساء )پارەی بۆ ئەنارد و یارمەتی ئەدا بە ئەمیری (العينه)ی وت ئەگەر تۆیارمەتی (محمدی کوری عبدالوهاب) بدەی یانی ناوی دەرچوو بوو لەوێی قەبریان ئەرووخاند وقوبەیان ئەرووخاند هەتا لەئافرەتیك زینای کرد مێردی کردبوو هات بۆلای شێخ إعتراف کرد وتی من زینام کردوە وەرە حەدی خوام لیٚ دەرکە و پاکم بکرەوە رەجمیان کرد ! یانی ئیقامەی حودودیشیان کرد لە مەنتیقەکەی خۆیاندا یانی وەکو ناوچەیەك کە پێغەمبەر (صل الله عليه وسلم) لەمەدینە إعلانی دەولەتی ئیسلامی کرد ئەوانیش لە (العينه)إعلانی دەولەتی ئیسلامیان کرد .

بەلام چواردەور پێیان خۆش نەبوو ئەمیرەکانی چوار دەور زۆر زۆریان پیٚ ناخۆش بوو عالەم هەلسا دەستیان کرد بە شکایەت کردن و ئەم کابرا تکفيرييە کی یە ئەم کابرا خواریجە کیٚ یە ئەم کابرا کافرە کیٚ یە ئەم کابرا فلانە کیٚ یە ! عالەم وا لیٚ ئەکا والیٚ ئەکا ،،،! هەتا ئەمیر و ئومەرای (نجديان)لیٚ ئاگەدار کردەوە لەوانە ئەمیر(إحسا ء)کە بەدەسەلات بوو پێی وت ئەگەر ئەو کابرایە دەرنەکەی بە ئەمیری(العينه)ی وت ئەوا نەپارەت ئەدەمی هێرشیشت ئەکەینەسەر ئەویش ترسا لەخۆیی !ئەو چوو بەشێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)ی وت وتی بەخوا حالەکەمان ئاوایە ئەبیٚ برۆیت لێرە عەیبە من بتکوژم لێرە تۆهاتویت چونکە نابیٚ تۆ هاتویت

بۆلامان ومن ئێستا لەداوی ئەو دەعوەش کە کردیان وتی غەدرە من تۆ بکوژم ئەو دەلی من دەبێ تۆ بکوژم بەلام هەستە برۆ لێرە مەمێنە.،

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) وتی رووبکەرە خوا و خوا سەربەخە والله ی خوا سەرت دەخا خەبات بکە لەپێناوی خوا خوای گەورە فەرموویەتی هەرکەسێك نەسرەتی من با من نەسرەتی ئەدەم ئەلێ چوو شەرمی لێکرد و رۆیشت دوای پیاوێکی بۆ نارد وتی برۆ پێ بلێی با بروات: بالێرە نەمێنێت ئێمە ناتوانین ئەمە بگرینە خۆمان ئیتر شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)توشی ناخۆشیەکی زۆر ئەبێ لەوێی هەستا رۆیشت رێگای گرتە بەر بۆ (درعیە)تەبعەن لەرێگاش کابرا پێی وتبوو ئەمیری (العینە)لەرێگا بیکوژە لەو کتابە باس ئەکا ئەلێ کە لەرێگا ویستی بیکوژێی کابرا لەریوایەتەکە وا ئەلێی ئەلێ کابرا دەستی تووشی شەلەل بوو ! ترسا زۆر ترسا ئەو لەپێشیەوە ئەرۆیشت بە حوشترەکەی (محمدی کوری عبدالوهاب) بەپێ ئەرۆیشت ئەو بەسوار بوو بەرێی ئەکرد ئەیوست لە(العینە) دەرچێتە دەرەوە لەرێگە ویستی بیکوژێی ئەلێ دەستی تووشی شەلەل بوو زۆر ترسا و گەرایەوە چو بەئەمیری وت وتی والله شتێکی ئەوها روویداوە ! .

ئیتر (محمدی کوری عبدالوهاب)چوو بۆ (درعیە)کە ئەچێت بۆ (درعیە)بزانین کوێی یە: شوێنی (محمدی کوری سعودە)تەبعەن ئەوکاتە دەعوەی توحید لەوێی نەبوو (درعیە)ش وەکو ئەمیرەکەی ئەوەتا ئەمیرەکانی شوێنەکانی تریش دەعوەی شێخ(محمدی کوری عبدالوهاب)یان پێی باش نیە ئەمیش لەسولتەی (محمدی کوری سعود)ئەترسێ کێ دەلێ ئەویش دەری ناکا ! بەس قوتابیەکی لەوێی هەبووە قوتابیەکەی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)کاتی خۆی کە هاتوە بۆ (العینە)دەرسی لا خوێندوە چۆتەوە بۆ (درعیە)ئەلێ پێی ئەلێت ئەچێتە مالی ئەوان میوانداری ئەکا کە میوانداری ئەکات قوتابیەکە زۆر زۆر لەخۆی ئەترسێ ناوی قوتابیەکەی (محمدی کوری سولیم حورەیمی ) دەبێ (ثم إن الشيخ قصد بلد الدرعية وصل أعلاء في وقت العصر فنزلت على محمد سوليم حريمي في بيت ونزل في ضيافتي فلما دخل عليه وظاقت عليه دار وخاف على نفسه امر درعية محمد بن

سعود وأع شيخ وسكن جيشه ،،،،،،،، )ئەلێ شێخش كەزانی وا تێك چوە قوتابيەكەی خۆيی وتی مەترسە خوای گەورە يارمەتيمان ئەدا ان شاء الله هەتاكو ئەگەر بێتوو وەكو چۆن موئەليف ئەلێ هەتا نارەحەتربێتەوە ان شاء الله فرج و دەرگاكردنەوەی خوای گەورە لەدوای ئەو نارەحەتيان ئەكرێتەوە(فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا)[10] ئەكرێتەوە بەئيزنی خوا .

ئينجا ئەلێ ئەم ئايەتانە ئەهێنێتەوە ئەلێ(وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ حَتَّىٰ نَعۡلَمَ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبۡلُوَاْ أَخۡبَارَكُمۡ)[11] خوای تعالی فەرموويەتی لە قورئاندا تاقيتان ئەكەينەوە بزانين كێی لەپێناوی ئێمەدا جيهاد ئەكا تێ ئەكوشێت دينی خوا بلاو ئەكاتەوە بۆئەوەی ئارامگر وصابرە دەربكەوی لەوەی كەوا ئارامگر و صابر نيە ! بۆئەوەی هەريەك لەئێوە إدعای ئيمانەكەتان دەربكەوێی ئەترسی يان ناترسی ! خۆ خوای گەورە ئەتوانی بەيەك لەحەزە هەموو سەرە زەوی بكا بەموحيد وبيكا بەئيماندار و بيكا بەدەولەتی ئيسلامی بەس خوای گەورە بەئێمەی وتوە ولن ينصرالله من ينصره ، كەواتە ئەبێ ئێمە هەستين بەنەصری خوا ئينجا خوا نەصرەتمان ئەدا نەصرەتی خوا كەی دێت كاتێك كەتۆ هەلسيت جا خوای گەورە حيكمەتی وايە ئەبێ صيراع لەنێوان حەق و باتلدا بروا ئينجا ئەمە پياوی ئەوێی بەراستی ئەبێ ترس فرێبدەيی ئەكوژرێی ئەكوژرێی سەرئەكەوی سەروكەتنی حسنين (إما شهدا وإما نصر).

ئەی باشە ئەگەر ئەوە نەكەين ئەی چی ئەكەی ! باسی خوا مەكە و هەرنان بخۆ و هەلسەوە و برۆ (٦٠ بۆ ٧٠)سالٚ هەرنابێ بمريی ! ئەی باشە بەعيزەتەوە بمری باشترێكە يان بەزەليلی بمری! ئەمەيە رێگەی موجاهيدان لەپێناوی خوا يانی تێ ئەكۆشن لەپێناوی خوادا ئەم پياوە لەحالەتێكی ئاوا نارەحەتيدا ئەم هەموو سەفەرەی كردوە ئەم هەموو دەردەسەری ونارەحەتيانەی بينوە دەربەدەريی مناصرێك نەبێ يارمەتی بدا ئێستاش رووی كردۆتە ئێرە بزانە خوای گەورە چۆن فريای ئەكەوێت !

---

[10] :سورة الشرح اية: ٥
[11] :سورة محمد اية : ٣١

ئەلێ کەسانێك دێن بۆلای بەخێرهاتنی ئەکەن زۆر ئەترسن لەوەی کەوا (محمدی کوری سعود)عزابی بدات و دەری بکات ئەویش دەعوەکەی قبول نەکا بەلام خوای گەورە دلی ژنەکەی بۆ تەرخان ئەکا ئەچن بۆلای خێزانەکەی (محمدی کوری سعود)پێی ئەلێن ئەم پیاوە پیاوێکی زۆرهەتا بلێ بەتەقەوا و ئیمان ودەعوەیەکی سەلامەت و ساغی ئەم دینەی پێی یە یارمەتی دەری بن با خوا تعالی رێزلەئێوەش بنێی ئافرەتەکە تەبعەن خوای تعالی یارمەتی ئەدا بەپیاوەکەی خۆیی ئەلێ زۆر دیفاعی لێ ئەکا ئەلێ دەباشە بابێت دەلی نا تۆ هەستە بچۆ بۆلای نەوەکو داوی خەلك بلێن وەلا بانگی کرد بۆ محکەمە کردن و محاسەبەکردن ئەویش بەپێی خۆی هەلدەستی و ئەچی بۆ مالی ئەو قوتابیە لەوی قسە لەگەل شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)ئەکا بەیعەت ئەبەستن !د

یانی نەك هەر شتەکە الحمدلله بەسەلامەتی کۆتایی دێی بەلکو لەوێدا (محمدی کوری سعود)لەگەل (محمدی کوری عبدالوهاب)کەباسی واقیعی دەعوە ئەکات وتوحید وئیمانی تێ ئەگەیەنێت بەیعەتی ئەداتی کە نەصرەتی ئەودینە بکات لەپێشا پێ ئەلێت ئەلێ من بە دوو شەرت دەعوەکەی تۆ قبول ئەکەم ؟

یەکەم : ئەگەر ئێمە سەرکەوتین لەودەعەوەکەدا تۆ نابێ (درعیە)بەجێ بهێلیت بۆشوێنی تر ئەبێ هەرلەناوماندا بیت .

دووەم :من خەراج وەردەگرم ئەو خەراجەی لەئەهلی (درعیە)وەرئەگرم لەوە بەروبوومەی سالانە ئەوەم لێ مەنع مەکە ! .

وتی بەنیسبەت ئەو خەراجەوە تۆ خوای گەورە شتی ترت ئەداتێ ئەوەندە غەنیمەت ئەداتێ گەر تۆ ئەم دەعوەیە بەریت بەرێوەوە ئێمە ئەچینە سەر هەموو ئەو شارو شارۆچکەو ولاتانە بەئیزنی خوا چونکە نیەتی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) دەعوە کردن وجیهاد کردن بوو نەك دانیشتن دەعوە بلاو کردنەوە خۆ هەر لە(درعیە)راناوەستی ٚ ئەرواتە سەر شارو شارۆچکەکانی کە هەتا خوای تعالی لەنیهایەتی دا جزیرەی عەرەبی بۆ فەتح ئەکا.

بزانە یانی لەحالەتێکی ئاوا ئەگاتە کوێی ئەوکاتە تۆ غەنیمەتێکی زۆرت هەیە غەنیمەتی خوا زۆر زۆر ئەبێ لەبەر دەستا لەوەی بیر لەخەراجی (درعیە)بکەیتەوە . !

بەنیسبەت خالی یەکەمیشەوە ئەلێ بەسەرچاو نارۆم هەر لەگەلتان ئەمێنمەوە.

بلفعل دەست ئەکەن بە دەعوە کردن ئا لێرەدا چی و چی کەوتن بەیەك ؟! وتمان :دین وهێز!ئەوە حەدیدی کەخوا باسی ئەکا وەك (إبن تیمە) ئەفەرمووی ڕەحمەتی خوای لێ بێ :پێویستە لەسەر موسلمانان بیر لەوە بکەنەوە قورئان وحەدید بکەن بەیەك ئینجا دینی پێ ڕاپەرینین .

ئیتر بەو شێوەیە دەست ئەکا بەموکاتەبە نوسین ئەنوسی ئەینێرێت بۆ ئەملا و ئەولا بەخەلکەکان ئەلێ دەی دەی وەرن بۆ ناو دینی خوا ئیتر ئەکەونە جیهاد ئەو هەموو جیشە دروست ئەکرێی ئەرۆن بۆ سەر ئەو شاروشارۆچکانەی ئەگەر إستجابەنەکا بۆ دەعوەکە قیتالی لەگەل ئەکەن وەناویان ئەبا بەموشریکین.

ئالێرەیدن مەوزوعێکی زۆر گرینگ دێتە پێشەوە لەشەرحی کشف شبهاتدا ئەی خوێنین ان شاء الله کە ئەوانەی شەرحی کشف شیهاتیان کردوە زۆرن تەبعەن مشایخ زۆر شەرحیان کردوە بەلام هەشە شەرحی کردوە بەعەرف شەرحی نەکردوە باسی مەوزوعی جهل بەدین عقیدە و ئەوبابەتانەیان کەباس کردوە تێکیانداوە بۆیە شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)لەو مەوزوعە ان شا ءالله بەتەفصیل باسی ئەکەین کە ئەو کەسەی بەلایەوە هاواری غەیری خوای کردبێ موشرك بووە بەلام ماوەتەوە سەرئەوە کیتابی بۆ ناردوە ئەگەر پاشگەز نەبیتەوە لێت ئەدەن ئەگەر تەوبە نەکەی بەموشریکی ئەرۆیت مرتدەی یانی بەعزابەوە ئەرۆیت تەواو یانی بیدایەت ناوی نا بەموشریك بەوەی کە بلێ (یارسول الله)(یاعبدالقادر)ئەوە موشریکە بەلام دێت چی بۆ ئەنێرێت کیتاب ئەنێرێت دەعوە ئەنێرێت ئاگاداریان ئەکاتەوە إستجابەیان ئەکات وەرن بێنەوە سەردینی ئیسلام هاتن موسلمانی وەك خۆمان

